# مثالب ابن أبي بشر

للشيخ المقرئ أبي علي الحسن بن علي الأهوازي

المتوفى سنة ٤٤٦ هـ

بە کوردی

وەرگێڕانی

شاب السني

بسم الله الرحمن الرحيم

# پەروەردگاریارمەتیدەربە

شێخ **أبو القاسم نصر بن أحمد بن مقاتل بن مطكود السوسي** هەواڵی پێداین بە خوێندنەوەم بەسەریدا ئەویش گوێی دەگرت ، ئەویش دانی پێدانا ، وتی : باپیرم پێی ڕاگەیاندین شیخ **أبو محمد مقاتل بن مطكود بن أبي نصری المقرئ السوسي** بە خوێندنەوە بەسەریدا چەند جارێک ، وتی شێخی ئیمام **أبو علي الحسن بن علي بن إبراهيم** ئەهوازی وتی :

سوپاس بۆ الله ﷻ کە هیدایەتی داین بۆ ڕاسترین دین ، وە بانگی کردین بۆ ڕۆزی و نیعمەتی هەتایی ، وە منەتی خۆی دا بەسەرماندا بە شوێن کەوتنی بەڕێزترین پێغەمبەر ، موحەمەدی ڕێزداری پاککراوە وە نزیکترین ڕزگارکەر ، صلى الله عليه و على آله ، وە شوێن و مەکانەتی ئەوانی پێشخستوە لە لای خۆی ، وە سەلامی لەسەر بێت.

من بینیم شتێک لە دیندا کە پێچەوانە بۆتەوە بە عەکسەکەی ، وە کەمتەرخەمی تێیدایە کە لە سنوری خۆی لایداوە ، سەرگەورەکان بوونەتە کەسانێکی بێدەسەڵات ، وە زۆر دەربڕینی باطل ڕێی پێدراوە ، وە کەم ئەقڵەکان

زۆر بوون و عالمەکان کەمبونەتەوە، وە ئەوانە نەمان کە شوبهەکانیان دەردەخست ، وە ئەهلی سوونە بەزێندراون ، مەگەر کەسێک نەبێت الله ﷻ بیپارێزێت ، ئەوانەش کەمینەن.

وە الله ﷻ بە فەزڵی نەبڕاوەی و خاوەن چاکەی گشتگیریی زەوی بەتاڵ ناکات لە بێژەرێکی شارەزا و زانایەکی دانا ، حەق دەڵێت و باتڵ وەلادەنێ ، وە ناهێڵێت وتەی خاوەن بیدعەیەک یان بابەتێکی بەرز و بڵندبێتەوە ، لە بەرئەوە فەرمویەتی « وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ » [آل عمران : ١٠٤]

واتا : پێویستە لە ئێوە ئومەتێک پێک بێت کە بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە، فەرمان بدەن بەهەموو کارێکی باوو دروست، قەدەغەی هەموو نادروستیەک بکەن، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.

بێگومان هیچ چاکەیک نییە باشتر لە سوننەت و هیچ خراپەیەک نییە ناشرینتر لە بیدعە.

والله فەزڵی نواندوە کە لە هەموو گروپە گومڕاکاندا ئەوەی دەرخستووە کەوا ئەکا لە بەر چاوی خەڵکی عەوام بکەون ، وە ئەوەش لە سێ شتدا خۆی دەبینێتەوە کە پشتیان لە فێرکردنی کردووە کە ئەوانیش بناغەی شەریعەت و

پایەی ئومەتن: زانستی ئایەتێکی موحکەم ، وە فەرموودەیەکی صەحیح ، وە عیبادەتێک کە الله بە دادپەروەری خۆی واجبی کردووە لەسەریان.

وە هەمیشە ئەمە نیشانەیانبووە هەتا **علي بن أبي بشر** دروست بوو کە ئەچێتەوە سەر **أبي موسى الأشعري**.

وە ئەم ڕەچەڵەکەی هیچ سودی پێناگەیەنێت لە دینەکەیدا، لەبەر ئەوەی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان ڕەزاو ڕەحمەتی الله یان لێبێت کوڕی کافر و بتپەرستەکان بوون ، وە الله جَلَّ جَلالُهُ فەرموویەتی «وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُمْ مُهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ» [الحديد: ٢٦].

واتا : بێگومان ئێمە نوح و ئیبراهیممان ڕەوانەکردووە، لەنەوەکانیشیاندا پێغەمبەرایەتی و کتێبی ئاسمانیمان دابەزاندووە، جا لەنەوەکانیاندا کەسانێک هەبوون کەڕێگە و ڕێبازی هیدایەت و خواناسی گرتۆتەبەر، زۆربەشیان فاسیقن.

وە ئادەم عَلَيْهِ السَّلَام باوکی مرۆڤەکان زۆربەی کوڕەکانی کافر و پشتهەڵکەرن. وە ئەگەر درۆ بکات و بوهتان هەڵدەبەستێت دەربارەی ڕەچەڵەکی ، ئەوا پێغەمبەری الله لەعنەتی لێکردووە ، وە ئەوەشی بەسە لە زەلیلی و هیچ و پوچیدا.

وه بانگەشەی ئەوەی کردووه کە لە ئەهلی سوننەیە [١]، وه خەڵکی توشی چەواشە کرد دەربارەی حاڵی ، وه گرووپێک لە نەزان و کەمنرخە گومڕاکان خۆیان دایە پاڵی ، وه بانگەشەی ئەوەیان کرد کە داوای زانستی کەلام دەکەن ، وه تیایاندا بوو کە خەریکی فیقهـ بووه ، بۆیە زۆرێک لە خەڵکی وایان زانی لەسەر حەقن و توشی بەهەڵەداچوون بوون ، لەبەر ئەوه بیروباوەڕەکەی بەربڵاو بۆیەوه وه دەنگیدایەوه لە ئاسۆدا ، وه ئەمەش هۆکارەکەی ئەوه بوو کە بانگەشەی سەرخستنی سوننەی دەکرد ، پەنا دەگرین بە الله ﷻ ، نەخێر بەڵکو لەعنەتی الله ی لێبێت و خوا ڕسوای بکات بیدعەی سەرئەخست ، وه بەبێ ئەوەی خەڵک ئاگادار بن قسەکانی موعتەزیلە و زیندیقەکانی دەخستە ناویانەوه ، ئەمەش بەبۆنەی خۆشەویستیان بۆ زانستی کەلام وه مەیلیان هەیە بۆی.

وه بزانە - الله تەوفیقت بدات بۆ ئەوەی خۆی پێی ڕازییە - **علي بن أبي بشر** لە ئەهلی بەصرەیە وه تێیدا لە دایک بووه و گەورەبووه ، وه زۆربەی تەمەنی تێدا بەڕێکرد ، وه خەڵکی شارەکەی خۆی بە حاڵی شارەزاترن لە کەسانێکی تر وه کۆمەڵێکم بینی کە بینیویانە و وه نقڵیان کردووه لەسەری و دەربارەی حاڵی بۆیان باسکردووین تا کاتی مردنی ، ڕەحمەتی الله ی لەسەر نەبێت.

---

(١) بزانە ڕحمەتی اللەت لێبێت ئەو نیفاق و دوڕوویە تا ئێستاش لەو گروپە گومڕایەدا هەیە . بەڵام هەمیشە زانایانی ئەهلی سوننە ڕوخسارە ناشرینەکەی ئەوانیان هەست پێکردووە ، وە ئەمڕۆش کەسانێك پەیدابوون کە ئەوان بە ئەهلی سوونە دەزانن ئەم گروپەش گومڕاییەکەیان لە ڕۆژی ڕوناك ڕوونترە ، وە گروپێکی تر کە لە ڕێگە سوونییەکە لایانداوە ئەوانەن کە هەندێکیان بە ئەهلی سوونە دەزانن و گەورەترین کێشەیان لەسەر ئەوەیە بڵێیت فڵان و ابن فڵان ئەشعەرین ، وە لە ناشرینترینان ئەوانەن کە دەڵێن بەڵێ فڵان و ابن فڵان ئەشعەرین بەس نابێ تەکفیر بکرێن ، دەی سووێندبێت بە الله هیچ قسەیەك لەمە خراپتر نییە کە کافرێك لە خەڵکی بکەیتە موسڵمان و با جوابێك بۆ بەردەم الله ﷻ حازر بکەن.

وە گوێم لە کۆمەڵێک بوو لە ئەهلی بەصرە کە دەربارەی ئەو شتی سەیروسەمەریان باسدەکرد، وە من -ان شاءاللە- هەموو ئەوەی بیستوومە دەربارەی دەیهێنم لەم چەند پەڕەیەدا کە نیەتم تەنها بۆ اللە یە، وە بە هیوای ئەوەی پاداشتم بداتەوە ، وە وەکو مافێک لەسەرم کە پرسیارت لێکردم ، وە بۆ اللە ی خاوەن دەسەڵاتە مەزنەکەی لە ویستمدایە کە تەنها لە پێناو ئەو بێت بە ئیخلاصەوە، وە بمگەیەنێت بە ڕەزامەندی ئەو ، ئەو بەڕاستی بەخشەرێکی ڕێزدارە.

بزانە -اللە تەوفیقت بدات بۆ ئەوەی خۆی پێی ڕازییە- کە من گوێم لە **أبا الحسن محمد بن محمد الوراق** بوو لە بەصرە دەیووت : گوێم لە **أبا بكر الوراق** بوو دەیوت : **إبن أبي بشر** لە ساڵی ٢٦٠ ه لەدایکبووە وە لە ٣٣٦ ه مردووە ، وە چل ساڵ موعتەزیلی بوو موناظەرەی لەگەڵ دەکردم لەسەر ئیعتیزال ، وە دوای وتی : من گەڕاومەتەوە لە ئیعتیزال جا نازانم بڕوا بە قسەی یەکەمی کەم یا دووەم.

وتی : هیچ شتێکم هەست پێنەکرد گۆڕابێت لە عەقڵیدا ، وە اللە ﷻ هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە کە لەسەر دەستی موعجیزە ڕویدا بێت ، یەکسەر خەڵکی واز لەوە بێنن کە تێیدان.

وە گوێم لە **أبا محمد الحسن بن محمد العسكري** لە ئەهواز بوو دەیوت -ئەم یەکێک بوو لە سەرخەرە زۆر ڕاستگۆکانی و لەیەکەم کەسەکان بوو کە پاڵپشتی کرد- گوێم لێبوو دەیووت : **ئەشعەری** قوتابی **جوبائی** بوو ، وانەی ئەخوێند لەلای و فێر ئەبوو لێوەی و شتی لێ وەرئەگرت ، وە لێی

جیانەئەبوویەوە ماوەی چل ساڵ ، گوێبیستی قسەی دەبوون لە مەجلیسەکاندا ، وە خاوەنی پێشڕەویەک بوو بەسەر بەرامبەرەکاندا ، بەڵام کەسێکی نووسەر نەبوو ، وە کاتێک هەوڵیدەدا بنوسێت تەواوی نەدەکردوو و دەیپچڕاند ، یاخود قسەیەکی ئەنوسی کە لێی ڕازی نەبوو ، بەڵام **أبو عەلی جوبائی** لێزان بوو لە نوسیندا و خاوەن قەڵەمێکی بەهێزبوو ، ئەگەر بینوسیایە ئەوا هێندەی کۆ دەکردەوە کە کەسێک سەیری کرد بەسی بێت بۆ گەڕان ، بەڵام لەکاتی موناقەشەو موجادەلەکردن لە مەجلیسەکاندا نەیدەتوانی شتێک بێنێت کە ڕازیکەربێت ، لەبەر ئەوە ئەگەر خەڵکێکی زۆر کۆبونایتەوە لە مەجلیسەکاندا ئەینارد بەدوای **ئەشعەریدا** و ئەیوت : تۆ لەجیاتی منبە ، وە لەسەر ئەمە مانەوە تا ماوەیەک ، ڕۆژێکیان **ئەشعەری** لەجیاتی **جوبائی** هات و موناقەشەی لەگەڵ کەسێک کرد و لەبەر دەستیدا دۆڕا ، کەسێکی تری لێبوو کە لە خەڵکی عەوام بوو ، دەستی کرد بە دابەشکردنی چواله و شەکر ، **ئەشعەری** پێی وت : من هیچم نەکردووە ، بەرامبەرەکەم بەسەرمدا سەرکەوت و باشتر توانی بەڵگەکانی خۆی بخاتە ڕوو ، وە لەبەر دەستیدا دۆڕام ، ئەو شایەنتر کە بەسەریدا دابەشی کەیت.وە لەدوای ئەمەوە پەشیمان بوونەوەی دەرخست وە گواستنەوەی کرد بۆ عەقیدەکەی خۆی ( ئەو عەقیدەیەی خۆی داهێنا ).

وە بیستم لە **أبا عبدالله الحمراني** لە ئەهواز ساڵی ٣٧٥ ھ دەیووت : بەبێ ئەوەی ئاگامان لە هیچ بێت لەپڕێکدا **ئەشعەری**مان بینی چۆتە سەر میمبەرەکەی مزگەوتەکەی بەصرە لە دوای نوێژی جومعە ، پارچە قوماشێکی پێبوو لە ناوەڕاستەوە توندی کردبوو و دڕاندنی ،وە وتی : شایەت بن کە من لە

سەر دینی ئیسلام نەبووم و وە من موسوڵمان بووم لەم ساتەوە ، وە تۆبەم کردووە لەوەی کە تێیدا بووم لە وتەی ئیعتیزال ، ئینجا هاتە خوارەوە.
**أبو عبدالله الحمراني** وتی : دوای ئەوە خەڵکی ڕاجیاوازیان تێکەوت دەربارەیی لە سێ ڕادا :

قوتابی و شوێنکەوتووەکانی و ئەوانەی ئەویان بە دڵە وتییان : ئەوە ڕاستیەکەی بۆ دەرکەوتووە جا شوێنی کەون.

وە گروپێک وتیان :خزمێکی هەبوو کە زۆر دەوڵەمەندبوو، وە لەو سەردەمە لە بەصرە دادوەرێکی لێبوو کە زۆر توند بوو لە بابەتی سوونەدا ، جا ئەو دادوەرە بە ئەوی وتووە : دوو کەس کە لە سەر دوو دینی جیاواز بن میراتیان لەیەک ناکەوێت ، وە میراتی پێ نەدا لەبەر ئەو تێگەیشتنەی خۆی ، جا ئەویش تۆبە و پەشیمانی خۆی دەربڕی تا میراتی بەرکەوت.

وە گروپێک وتیان: ئەو خەریکی زانستی کەلامبووە و ژیانی خۆی تیادا فەوتاندووە ، وە گەیشتۆتە ئەو پەڕی زانستەکە ، وە سەیری کرد لە ناو خەڵکدا پلەیەکی بەدەست نەهێناوە ، وەهەروەها پێگەیەکی بەدەست نەهێناوە لای کەسە تایبەتە خاوەن عیلمەکان ، تۆبەی دەرخست بۆ ئەوەی خەڵکی ڕووی تێبکەن و لێی وەرگرن وە پێگەیەک بە دەست بێنێت ، وە گەیشتیش بەوەی کە دەیویست .

وە ئەم **أبو عبدالله الحمراني** زانایەکی دیاری زمان بوو و بەنرخ بوو لە العروض و الأخبار و الأشعار ،لە پێشەوەی ئەو بابەتەدا بوو ، کەسێک نەبوو

که دەمارگیری هەبێ لە دیندا و لاینەدەدایەوە بەلای توندیدا ، وە بێجگە لە حەق هیچی تر ناڵێ لەوەدا .

وە بیستم لە **أبو عبدالله الحمراني** وتی : ڕۆژێکیان لە جەنازەی ئامادەبووم لە بەصرە ، جا کاتێک کە مردووەکە دەنێژرا ، لەو کاتەدا ئێمە لەسەر لێواری گۆڕەکە بووین و **ئەشعەری** لە پاڵ مندا وەستابوو ، جا گۆڕهەڵکەنەرەکە دەیوت : ئەی خودایە چاڵەکەی بۆ فراوان بکە ، وە یارمەتی بدە لە وتنی بەڵگەکانی ، وە شوێنەکەی بۆ ئیسراحەت و فێنک بکە ، وە بۆی ئاسان بکە ئەوەی بەرەو ڕوی دێت ، **ئەشعەری** وتی : وە وایلێبکە پیسایی خۆی بلێسێتەوە .جا من ڕوم تێکردوو وتم: ئەمە قسەی ئەوانە؟! ، ئەویش وتی : من لە لای ئەوان لەدایک بووم .

لە **أبو عبدالله الحمرانيم** پرسی : واتای چیبوو کە تۆ لێت پرسی ئەمە قسەی ئەوانە؟! ، پێی وتم:واتا ئەمە قسەی مولحیدەکانە[٢] ئەویش وتی من بە مولحیدی لەدایک بووم ، الله لەعنەت لێیبکات و سەرشۆڕی بکات .

(٢) وشەیی مولحید مەبەستی پێی ئەوانەن کە قسە لە ناوەکانی اللهدا دەکەن و بۆی زیاد دەکەن و گۆڕانکاری تێدا دەکەن و بە درۆی دەخەنەوە وەک الله دەفەرموێت(( وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ )) [ الأعراف: ١٨٠] واتا : هەر بۆ الله یە جوانترین و چاکترینی ناوەکان جا ئێوەش بەو ناوانە بانگ و هاواری لێ بکەن واز بهێنن و نرخ دامەنێن بۆ ئەوانەی کە لەناوەکانی (خوا) دا گۆڕان و لادان دەکەن بەزوویی تۆڵەی ئەوەی دەیانکرد لێیان دەسەندرێت . ئەمەش ڕێک ئەو کارەیە کە موعتەزیلە دەیانکرد و **ئەشعەری**ش لەوان بوو.

سەبارەت بە تۆبەکەی لێی قبوڵ ناکرێ چونکە الله ﷻ ئەفەرموێت «إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ثُمَّ ازْدَادُوا كُفْرًا لَنْ تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الضَّالُّونَ »[ آل عمران : ٩٠ ].واتا: بە ڕاستی ئەوانەی کە کافر بوون دوای بڕوا هێنانیان پاشان کوفریان زیادی کرد هەرگیز تەوبەیان لێ گیرا ناکرێت ئا ئەوانە ئەوانەن کە گومڕابوون.

وە ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی «التوبةُ مُحرّمةٌ عَلى كُلِّ صاحِبِ بِدْعةٍ »

واتا : تۆبەکردن ڕێگەنەدراوە بۆ هەموو خاوەن بیدعەیەك[٣].

فەرموویەتی «إِنَّ اللّهَ عَزَّ وَجَلَّ احْتَجَبَ التَّوْبَةَ عَنْ كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ»

واتا : الله ﷻ تۆبەکردنی داپۆشیووە لە هەموو خاوەن بیدعەیەك[٤].

وە فەرمویەتی «إِنَّ اللهَ حجَرَ التَّوبةَ عن كلِّ صاحِبِ بِدْعةٍ »

واتا : الله ﷻ تۆبەکردنی قەدەغەکردووە لە هەموو خاوەن بیدعەیەك.

وە فەرموویەتی« إنَ كُلَّ ذَنْبٍ لَهُ تَوبَةٌ إِلا صْاحِبُ بِدْعَةٍ ما لَهُ تَوْبَةٌ »[٥].

---

(٣) لە ڕیوایەتەکەی ابن ماجە کە فەرموودەی ژمارە (٥٠)یە دەڵێ ((حَتَى يَدَعَ بِدْعَتَهُ )) واتا : هەتا واز لە بیدعەکەی دەهێنێت و پەشیماندەبێتەوە ، ئەو کاتە تۆبەکەی لێوەردەگیرێ و بەم شێوەیەش باشتر لە فەرموودەکە تێدەگەین.

(٤) واتا : وای لێدێت هەر خۆی بەڕاست دەزانێت و لەسەر گومڕاییەکەی بەردەوام دەبێت ، الله تەوفیقی نادات بۆ ڕاستەڕێ ، ئەمەش زۆربەی جار بەبۆنەی یەکێکە لە نەخۆشیەکانی دڵ کە خۆبەگەورە زانینە.

واتا : هەموو تاوانێك تۆبەكردنی بۆ هەیە بەس خاوەن بیدعەیە نەبێت كە تۆبەكردنی بۆ نییە.

وتی : وە لە هەواڵەكانی نەوەی ئیسرائیل كە پیاوێک بیدعەیەکی دەرخستووە دوای ئەوە تۆبەی لێکردووە الله ﷻ وەحی بۆ پێغەمبەری ئەو کاتە کرد کە ((بە فڵان کەس بڵێ : لە بیدعەکەت تۆبەی کرد ، ئەی چی دەربارەی ئەوانەی گومڕات کردن)).

وە خەڵكی چەند پۆلێكن لەو بابەتە : پۆلێکیان تۆبەی لە تاوانێک کرد کە بەس پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە ، الله ﷻ لێی قبوڵدەکات و لێی خۆشدەبێت. وە گەر کەسێک تۆبە بکات دەربارەی تاوانێک کە پەیوەندی بە کەسانێکی ترەوە هەیە، جا ئەو تاوانە بیدعەیەکە کە غەیری ئەو بۆتە بیروباوەڕ لایان ، یان تاوانێک کە کەسانێکی تر لەبەر ئەو کردوویانە ، ئەو هۆکاری تاوانەکە بووە ، ئەوا تۆبەی لێ وەرناگیرێت ، یان تۆبە و وازهێنان لە تاوانەکە بەو کەسانە بکات کە ئەو تاوانەیان کردوو لەبەر ئەو ، ئەگینا تۆبەیەکی ڕاستی نەکردووە. هەروەها سەبارەت بە کەسانێک کە بیدعەیەک بۆتە بیروباوەڕیان و تۆبەی لێناکەن و ناگەڕێنەوە لێی ، وە ئەو کەسەی کە بیدعەکەی کردووە وا نەزانێ لەسەر بەتاڵ بووە ، وە ئەمەش شتێکە هەرگیز نەمان بینیووە لە دنیادا لە تۆبەکردنی بیدعەچیەکی پێشەوا لە بیدعەکەیا ، کە بانگەشەی بۆ دەکات ، وە دەمەدەمێ دەکا لە پێناویدا ، وە دژایەتی ئەکات لەبەری.

---

(٥) بزانە ڕەحمەتی اللهت لێبێت هیچ کام لەو فەرموودانە نەچەسپاوە و الله اعلم و لە تابیعینیشەوە هاتووە ،وە ابن أبی عاصم هێناویەتی لە کتێبی ((السُنَّةْ)) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە واتاکەی بە ڕاست دەزانێت و ئەویش کەسێکە لە ئەهلی علیم.

وه هەندێ لە زانایانی بەصرە وە پێی وتراوە : فڵان تۆبەی کردووە لە بیدعەکەی ، بە زمانی ئیمانی هێناوە و بە دڵی ڕەتی ئەکاتەوە، وەکو مونافیق ئەژی و بە کافری دەمرێت.

وە **ئەشعەری** کتێبێکی هەیە کە هاوەڵەکانی کردویانەتە پارێزەرێک لە ئەهلی سوونە ، بەو کتێبە ڕوبەڕووی عەوامی ئەهلی سوننە دەبنەوە ، ناوی ناوە کتێبی «**الإبانة**» ، لە بەغداد نوسیویەتی ، بەڵام حەنبەلییەکان لێیان قبوڵ نەکردووە و هەجریان کردووە .

لە **أبو عبدالله الحمراني** بیستوومە : کاتێ **ئەشعەری** هاتە بەغداد چووە لای **بەربەهاری** و پێی وتووە : جوابی **جوبائی** و **ئەبی عەلی هاشمم** داوەتەوە ، وە دژیان وەستام ، وە جوابی یەهودیەکان و گاورەکانم دایەوە ، وە جوابی ئاگر پەرستم دایەوە و وە لەنێوانماندا موناقەشەی ئەوهاو ئەوها ڕویدا ، دەربارەی ئەم بابەتە قسەی زۆر کرد ، کاتێک بێدەنگ بوو **بەربەهاری** وتی : ئەوەی کە وتت هیچی لێ نازانم بەڵکو ئێمە بەس ئەوە دەزانین کە **باوکی عەبدو الله ئەحمەدی بن حەنبەل** ڕەزاو ڕەحمەتی الله ی لێبێت، **ئەشعەری** ڕۆیشتە دەرەوە

و کتێبی ((**الإبانة**))ی نوسی بەڵام لێی قبوڵ نەکرا ، وە لە بەغداد دەرنەکەوتووە تا چووە دەرەوە لێی[٦] .

وە بابەتێکی هەیە تێیدا دەڵێ ئیمان مەخلوق نییە ، من وامئەزانی بۆیهەڵبەستراوە ، هەتا أبو الحسين إبن أبي المعتمر پێی وتم : کەوتە دەستم کاتێ لە ڕەققە بووم ئیتر پێم سەیربوو ، بۆیە لەگەڵ خۆمم برد و ڕۆیشتم بەرەو خوارەوە بەرەو بەغداد بەس بۆ ئەوە ، چووم بۆ لای ئیبن باقلانی پیشانم دا وە پێم وت ئەوە چییە ، پێی وتم : ئەوە ڕاستە لە ئەوەوە هاتووە ( **ئەشعەری**)، ئەوە کە نوسی ویستی خۆی لە حەنبەلییەکان بپارێزێت. ئای ئەمە چەند ڕون و وازحە کە بابەتێکی نوسیووە و کتێبێکی دارشتووە و بەشایەتی تەلەبەکانی کە ئەوە عەقیدەی ئەو نییە ، بەڵکو کردییە پارێزەرێک لە دژی دوژمنەکانی ، باشە ئەمە چۆن تۆبەکردنێکە ؟!! ئا بەو شێوەیە وا خۆی دەرخست کە وایە بەڵام نەیکردە مەزهەب و عەقیدەی خۆی.

وە سەلمێنراوە لە ئەوەوە بە گواستنەوەی پیاوە بەڕێزەکان کە ئەو خاوەنی دین نەبوو ، وە زۆر بێ باکی ئەکرد لە بابەتی شەریعەدا وە کاری خراپی ئەنجام دەدا و وازی لە واجبەکانیش دەهێنا.

---

(٦) سەرنج بدە ڕەحمەتی الله ت لێ بێت کە حەنبەلییەکان چۆن ئەو کابرایەیان ڕەتکردۆتەوە ،وە هیچ قسەیەك نیزکتر نییە لە ڕاستی بێجگە لەوەی بوترێت ئەوان شتێکیان لە بیروباوەڕی بەدی کردووە ، وە هەرکەسیش بڵێ ئەم کارەی حەنبەلییەکان بە هۆکارێک بووە کە پەیوەندی بە عەقیدەوە و بیروباوەڕی ئەو پیاوەوە نەبووە ئەوە حەنبەلییەکانی بە شتێکی زۆر ناشرین وەسف کردووە ، ئەمەش لە کەسێک لایەق نییە کە خۆی بە شوێنکەوتووی سەلەف بزانێت کەچی گومانی باش بە بیدعەچییەک ببات و گومانی باش بە پیاوە بەڕێزەکانی ئەهلی سوونە نەبات.

گوێم لە **أبا الحسن محمد بن أحمد** بوو کە شایەت بوو لە ئەهواز دەیووت: دوو پیاو موعتەزیلی بوون کاتێک وازیان لێهێنا بوونە مولحید **إبن الراوندي** و **ئەشعەری**.

گوێم لە براکەم بوو **أبا الحسن أحمد بن علي** دەیووت : گوێم لە **القاضي ابن الصخر** بوو دەیووت : گوێم لە مامم **أبا محمد بن صخر** بوو دەیووت : گوێم لە **أبا الفضل بن بقال** بوو دەیووت : گوێم لە **أبا علي بن جامع** - شایەنی ڕێزلێگرتنە - دەیووت : لەگەڵ **ئەشعەری** بووم ماوەی بیست ساڵ نەمبینی نوێژ بکات هەرگیز.

وە هەروەها لە ڕۆژی جەژن چووینە شوێنی نوێژ کردن : کاتێک کە گەیشتینە شوێنێک کە چۆڵەوانی بوو ڕۆیشت لەو ناوە میزی کردوو هاتە دەرەوە دەستی لە ئاو نەدا ، پێم وت : ئاوت ناوێ بۆ دەست نوێژ ، جا هەموو ڕێگاکە کەسانێکی تیابوو ئاوی ساردیان پێبوو ، پێی وتم : نا تۆزقاڵە میزی جەژن هەر پێویستە ، کە گەیشتینە شوێنی دیاری کراو بۆ نوێژەکە لەگەڵ خەڵک نوێژی کرد بەبێ دەست نوێژ.

**أبو علي بن جامع** وتی : کاتێک گەڕاییینەوە وازم لێهێنا و هەرچی لە ئەووەوە نوسیبووم دڕاندم وە هەرگیز نەچوومەوە بۆ لای وە چوومە لای خەڵکی تر.

وە ئەم **أبو علي بن جامعه** پیاوێکە لە بەڕێزترین پیاوەکانی بەصرەیە.

بیستم لە **أبا إسحاق الطبري** لە بغدادی وتی : بیستم لە **قاضي القضاة ابن أم شيبان** دەیوت : **أبو عمر القاضي** پێی وتم : برۆ بزانە ئەم **أبي علي بن جامعه** کەسێکی چۆنە ، چونکە من ئەمەوێت بڕیارێکی حەق لەسەر بدەم ، جا منیش گەڕام بینم کە کابرایەکە وەک ئاڵتون وایە .

بیستم لە **أبا سهل بن الصابوني** لە دیمەشق ساڵی ٣٩٢ هـ وە هەروەها **أبا أسامة محمد بن أحمد الهروي المقرئ** لە مەککە ساڵی ٣٩٥ هـ هەردووکیان دەیان وت : گوێمان لە ئیمامی فەقیهـ **ابن سهل الصعلوكي** لە نەیسابوور دەیووت : گوێم لە باوکم بوو دەیووت : جاری وا هەبوو ڕاجیاوازیەک هەبووایە ئەمبردە لای **ئەشعەری** ئیتر لە ئەوەوە شتێکم ئەنوسی، وتی : ڕۆژی جومعە چوومە لای دوای ئەوەی نوێژی عەسرمانکردبوو ، ئیتر لە درزی دەرگاکەوە بینیم میزی دەکرد ، کاتێک کە تەواو بوو چوومە ژورەوە ، پرسیاری لێکردم : نوێژی عەسر تان کرد ؟ ، وتم : بەڵێ ، ئیتر هەستا نوێژی کرد بەبێ ئەوەی دەست نوێژ بگرێتەوە ، ڕۆیشتمە دەرەوە و هەرچی لەوەوە نوسیبووم دراندم ، وە هەرگیز نەچوومەوە لای.

وە کاتێک **ئەشعەری** لە بەصرە بوو کەس نەدەچوو بۆ لای لە ئەهلی عیلم بۆ بابەتی پرسیار لێکردن، لەبەر ئەوەی سوپاس بۆ الله ﷻ کەسێکی خاوەن عیلم نەبوو ، وە دەنگوباسی بڵاو نەبوو و تەلەبەشی زۆر نەبوو ، بەڵکو چوار تەلەبەی هەبوو ، بەڵام ئەم چوار بوونە بانگەشەکەری لە ئاسۆکانی زەوی ، یەکێک

لەوانە **ابن عيون الضراب** بوو ، ڕۆیشت بۆ بەغداد و دانیشت تێیدا تا مرد ڕەحمەتی خوای لێ نەبێت ، وە نەیئەتوانی هیچکام لەو کوفرانەی ناو بیروباوەڕەکەی دەرخات لەبەر ترسی لە حەنبەلیەکان.

وە گوێم لە **أبا عبدالله بن حامد** بوو دەیوت : **ابن عيون الضراب** هاتە لای ئێمە، بەڵام هەرگیز ئەم سەرشۆڕیەی دەرنەخست.

وە یەکێکی تر لە تەلەبەکانی **القلانسي** کە ڕۆیشت بۆ ررەی تا تیای مرد.

وە یەکێکی تریان **عبدالعزیز** ناسراو بە **دُمَّل** گەشتی کردووە بۆ شام و بۆ میصریش، مایەوە لەوێدا هەتا مرد.

وە یەکێکی دیکە **أبو عبدالله بن مجاهد** لە بەصرە مایەوە تا مرد.

وە براکەم **أبو إسحاق بن لولو** پێی وتم : **أبو عبدالله مجاهد** لە ناوەڕاستی مزگەوتەکە لەسەر عەرزەکە دادەنیشت ، وە لە زستان سەری دانەدەپۆشی ، وە خەڵکی پێی پێدەکەنین و جەوی خۆیان پێ وەردەگرت ، وە لە نەفسی خەڵکیدا نرخێکی نەبوو ، وە بە عالمیان نەدەزانی ، وە دەنگوباسیشی نەبوو لەناو خەڵکدا.

وە سێ تەلەبەی هەبوو ؛ **ابن باقلاني** ،**ابن فورك**، وە **أبو الحسن الطبري** .

سەبارەت بە **ابن الباقلاني** شاگردی وشکەوات فرۆشێک بوو، هەموو ڕۆژێک بە چوار دانیق لە کۆشکی زەیت کاتێک وردە وردە حاڵی باش ئەبوو، لە دوای

ئەوەی کە پوشی دەخستە ژێر مەنجەڵی فاسۆلیا بۆ باوکی **طبيان الباقلاني** دوای ئەوە تێکەڵی دەسەڵاتداران بوو کە بووە هۆی ئەوەی بەرزبێتەوە پێی نەک بە عیلم .

سەبارەت بە **إبن فورک** گەشتی کرد بۆ نەیسابور وە تێیدا مایەوە تا مرد.

ئینجا **أبو الحسن الطبري** هەرگیز وا دەرنەدەکەوت بە قسەکردن و پەیوەست بوو بە مەجلیسی أبي علي المروزي لە بەصرە، وە وازی لێ نەهێنا هەتا مرد ، وە من لە بەصرە ئەوم بینی.

وە **ئەشعەری** لە زانستەکانی قورئان و فیقهـ و حەدیث پێگەی نەبوو ، وە هەموو ئەوانەی لەسەر مەنهەجی کەلام بوون هەروا ، ئەگەر بە عولەماکاندا پشکنین بکەین کەسێک لەوان نادۆزینەوە کە خوێنەرێکی جێ باسکردن بێت ، وە لە فەقیهەکانیشدا ، وە لەگەڵ هاوەڵانی حەدیثیشدا ، بەڵکو دەیاندۆزینەوە لەپێشی فەلسەفی و هەندەسیی و مەنطقی و زیندیقەکانەوەن ، وەلەگەڵ ئەوانەن کە کوفر و ئیلحاد دەڵێن ، وە وازهێنان لە قورئان و سوننەت و شوێنکەوتنی قیاس و ترسناکی .

وە هەمیشە - سوپاس و  میننەت بۆ الله - قسەکانی **ئەشعەری** جێهێڵدراوە ، کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە وە نرخی بۆ دانانرێت ، هەتا ئەم گروپە دروست بووە کە دەڵێن : قورئان و ئەثەر وەرناگرین ، یەکسەر بەرەوە رووی ڕۆیشتن ، وە بە هەردوو دەستیان لێگیرکردووە ، جا گروپێکیان ڕۆشتن بەرەو

خوراسان ، وە گروپێک ڕۆشتن بەرەو مەغریب ، وە گروپێک بەرەو حیجاز ، وە کەمتر لە سی ساڵە بەهێزبوون و بەناوبانگ بوون ، وە الله ﷻ بە فەزڵ و چاکە و بەخشین و منەتی خۆی ناهێڵێت لە زەوییەک لە زەوییەکان بەتاڵبێ لە کەسێک کە قسەکانی ئەوان پوچەڵدەکاتەوە ، وە ئابڕووچونەکانیان ئاشکرا دەکات ، وە ئەیدا بەسەری قسەکانیاندا ، وەڕێگە نادات کە پێگەیان بەرزبێتەوە ، وەک چۆن ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی (( لا تَزالُ طائِفَةٌ مِن أُمَّتي يُقاتِلُونَ علَى الحَقِّ ظاهِرِينَ إلى يَومِ القِيامَةِ ))

وە **ئەشعەری** هەر مایەوە ئەسوڕایەوە بە ناوچەکاندا و قسەکانی وەرنەدەگیرا، وە ئاستی بەرزنەدەبوویەوە ، بێهێز بوو و قبوڵکراو نەبوو لە ناوچەی مسوڵمانان، وە لە پاڵ مسوڵمانان عیزەتی بەدەست نەهێنا ، وە عولەماکانیش بەڕویدا نەگەشانەوە بە ڕوویدا ، هەتا چووە ئەحساء ، کە ناوچەیەکە ئیماندار تێ ناچێت ، وە موسڵمانێک خۆی بۆ ناگیرێت تێیدا ، بەڵکو فاسقە فاجرەکان دەچنە ناوی ، وە ئەوانەی خۆشەویستی و نزیکیان هەیە لە قەڕامیطە کافرەکان، وە هەر لەوێ بوو تا مرد ، ڕەحمەتی الله ی لێ نەبێت ، وە پشوونەدا لە گۆڕەکەی وە ئاگر بکاتە شوێن و جێگای.

گوێم لە **عبدالله محمد بن العلان المحرسي** بوو کە شێخێکی پەروەردەکاری پیاوچاکبوو لە مەککە بینیم بە پێوەبوو خۆی ئامادەکردبوو بۆ

ڕۆیشتنەوە لەگەڵ حاجییەکانی خوراسان ، جا ڕۆیشتمە پەنایەوە و داوام لێکرد دوعام بۆ بکات ، ئەویش دوعای زۆری بۆکردم و گریا ، دوای دوعاکان دەموچاوی خۆی سڕی بە دەستی وتی : ئەم قسەیە لەمنەوە وەرگرە کە ئەتوانی خەوی ئەشعەریەکانی پێ بزڕێنیت، **ئەشعەری** لە ئەحساء بە سەرخۆشی مرد بەسەر پشتی مناڵێکەوە، لەعنەتی الله ی لێبێت و سەرشۆڕبێت . وە دۆزەخ بکاتە جێگای وەهەرکەس کە بیرو باوەڕی وەک ئەوە.

جا داوا لە پەروەردگاری خاوەن ڕەحم و دانایی و زانایی دەکەم کە ئەو فەزڵەی پێی داوین بەردەوامی بکات بۆمان وە بێ بەشمان نەکات لە فەزڵ و نیعمەتەکانی خۆی ، ئەو بەڕاستی میهرەبانە بە بەندەکانی و بە ڕەحم و بەڕێزە .

ئەم بەشە زیادەیەکە کە بە بیستن بۆمان گوازراوەتەوە لە **نجا بن أحمد العطار** لە **أبي علي** ەوە ڕەحمەت الله ی لێبێت: وە لە سەرسوڕهێنەرترین شتەکان لە بەصرە بە **ابن أبي بشر** ناسراو بوو ، بەڵام تەلەبەکانی ڕایان دەکرد لەو ناوەیی ، وە قەد ئەوەیان بۆ بەکار نەدەهێنا ، وەگوێم لە شێخانێک بوو دەیانووت ئەهلی بەصرە دەیانووت: ئەم خۆلادانەیان لە ئەو ناوە تانها لەبەر ئەوە بوو کە باپیری **أبا بشر** (**ئەشعەری**) پیاوێکی یەهودی بوو ، مسوڵمان بوو لەسەر دەستی پیاوێک لە ئەشعەرییەکان ، جا لەوێوە خۆیداوەتە پاڵیان ، وە الله زاناترە.

وە لەناو هۆنراوە بەربڵاوەکاندا وتراوە :

و ما كنى عن أبيه　　　إلا و ثم سبيب

واتا : ناوی باوکی نەدەهێندرا مەگەر جنێوێکی پێنەدرێت جا جنێوەکە بچووک بیت یان گەورە بەڵام لێرەدا بچوکەکەی وەک ئەوە هێناوە کە زیاترە.